لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# فەرهەنگی لەک و لوڕ

دانان و کۆکردنەوەی :

حەمیدی ئیزەدپەناه

لێدوان و بەراوردکردنی

مەحموود زامدار

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا ــ ١٩٧٨

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# فەرهەنگی لەک و لوڕ

دانان و کۆکردنەوەی :

حەمیدی ئیزەد پەناه

لێدوان و بەراوردکردنی

مەحموود زامدار

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا ـ ١٩٧٨

لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# فەرهەنگی لەک و لوڕ

دانان و کۆکردنەوەی :

حەمیدی ئیزەدپەناه

لێدوان و بەراوردکردنی

مەحموود زامدار

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا

١٩٧٨

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

# قاموس

## ( لك ) و ( لر )

جمعه : حميد ايزدپناه

تحقيق ومقارنة : محمود زامدار

مطبعة المجمع العلمي الكردي

بغداد ـ ١٩٧٨

**خوێنەری هێژا :**

دوکتۆر (بهرام فرەوشی) ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەنی (ایران باستان) بەم چەند وشەیە فەرهەنگەکە دەکاتەوە و دەڵێ :

« دیالێکتە ئێرانیەکان پڕن لە گەنجینەی زۆر گەورەی ئەدەبیات ، کە لە سەرمایەی بە نرخی مەعنەوی وڵاتە دێرینەکەمان و پاشماوە شارستانیە گەورەکەی ماوەتەوە. ئەو سەرمایە گەورەیە ــ بە داخەوە ــ بەرە بەرە وا لە دەس دەچێ و بە تێپەڕینی رۆژگار دیالێکتە کۆنەکان دەکوژێنەوە و لە بیر دەچنەوە .. یەکێ لە ئامانجەکانی ئەنجومەنی ( فرهنگ ایران باستان ) کۆکردنەوە و پاراستنی ئەو دیالێکتانەیە [1] .. کتێبی فەرهەنگی لوڕی یەکەمین کتێبی زنجیرەی دیالێکتە ئێرانیەکانە .. هیوای ئەوە هەیە کە ئەنجومەن بتوانێ دیالێکتە ئێرانیەکانی تریش ، کە چەند سەدێکن ، کۆبکاتەوە و بڵاویان بکات [2] زۆر سوپاسی دۆستی زانامان کاك دکتۆر

---

(1) گەڕان و سۆراخ و ساغکردنەوەی دیالێکتەکانی کوردی (دایك) مەزنترین و کوردانەترین کارێکە . لە بەردەم ئەدیب و رۆشنبیر و زانایاندا .

(2) لە ئەنجامی تێکەڵاوی گیانی بە گیانانەی لوڕەکان لەگەڵ میللەتی فارس و لەبەر ئەوەی ئەم میللەتەیش . وەکو میللەتێکی گەورە و حوکمڕان، دەوری مێژوویانەی خۆی دەبینێ .. بۆیە زۆر شتی ڕۆژانەی سیاسی و رۆشنبیری و شارستانی لە ئەم وەرگرتوە ، هەروەکو چۆن ئەم دیاردەیە لە نێو ئێمەدا لەگەڵ برا عەرەبەکان هاتۆتە کایەوە ؛ هەروەك کوردەکانی کوردستانی تورکیا و کوردەکانی یەکێتی سۆڤێت و سوریایش .

( منوچهری سوده ) ماموستای زانستگا . دەکەین کە لە کاری ناسینی دیالێکتە ئێرانیەکاندا ماموستایەکی بێوێنەیە و کتێبی فەرهەنگی لوڕێش لەژێر چاودێری ئەواندا . ئامادە و ڕێك و کۆك کراوە .. هەروا سوپاسی کاك ( حەمیدی ئیزدی پەنا )یش دەکەم . کە دیالێکتی زگماکی خۆی کۆکردۆتەوە و لە سازکردنی ئەم فەرهەنگەدا زۆر ڕەنجی کێشاوە . هیوادارم کە درێژە بە کاری سودمەندی خۆی بدات .

سوپاسی خاتونی خێرخواز ( فەرەنگیز یەگانەگی ) کە خەرجی چاپکردنی ئەو کتێبەی لە سەرمایەی خوالێخۆشبو . جەمشیدی یەگانەگی داوە ، سلاوم بۆ گیانی ئەو پیاوە خێرخوازە دەنێرم ..

هەروا سوپاسی دۆستی هونەرمەند کاك ( اکبر قطره دریائی ) دەکەم . کە ئەم کتێبە بە یارمەتی ئەوان گەیشتۆتە بەردەست .



# سەرەتـا

لە پاشا ( زانابەکی ! ) دیکەی ( منوچهر ستوده ) ناو دەقی سەرەتاکە دەشکێنن و بەم چەشنە دەدوێ :

« نزیکەی سەد و پەنجا زاری جۆێ جۆێ لە دیالێکتەکانی (فارسی ! ) کەلە ئێرانی گەورەدا . تـا ئەمڕۆ برەویـان هەیـە ، جێگەی سـەرنج و ئێرامانی زمانناسانی ئەوروپایی و ئێرانیـە .. ئەو دیالێکتانە هەر لەو کاتەوە کە زمانی فارسی کۆن لـە بارەگای هەخامەنشیەکاندا برەوی هەبۆ ، لـەو زەمانەدا زەردەشت پێغەمبەری ئێران گاتەهای دەنوسی ، لەو سەردەمەدا کە ساسانیەکان بە زمانی پەهلەوی دەدوان . لە سەرتاسەری ئێراندا هەبۆن و زمانی وتووێژی تیرە جیاجیاکانی ئاریایی‌بۆن .. گرینگی و نرخی ئـەو دیالێکتانە لە ـ بەردنوسەکانی ـ هەخامەنشیان یـا ئاوێستای زەردەشت، یا نوسراوەکانی پەهلەوی کەمتر نین . زمانی فارسی و زمانی ئاوێستا و زمانی پەهلەوی رۆژێ لە رۆژان . یەك لەو دیالێکتانە بۆن [1] .

هەریەك لەو دیالێکتانە . پڕن لە وشە و تەرکیبات و زاراوەی رەسەنی فارسی و هەریەك لەوانە دەکرێ بۆ فارسی ببنە کانگەی ئیلهام‌بەخش .

ئەو دیالێکتانە لە کۆنیشەوە . ئەدەب‌دۆستان پەیوەندیان پێ نەبوە و

---

[1] بو سەدەیێ دەبێ ، گەلێ وشە و دەستەواژەی تازەبابەتی کوردی لەرێی گۆڤار و رۆژنامەکانەوە . کەوتۆتە نێو زمانی ئەدەبیمان . کە لە نە نەژادا لوڕین .. هەمان شتیش بۆ کرمانجی ژۆرۆ .

ئەدیان و زانایان کەمتر سەرنجیان داوێ . رەنگە کۆنترین کەسێ کە بایەخی‌پەوان داوە (مقدسی) جوغرافی زانی بە ناوبانگ بێ ، کە لە گەشتەکەی خۆیدا . گەیشتۆتە هەر شارێ . سروشتە تایەتیەکانی دیالێکتی ئەو ناوچەیەی زۆر کورت و ساکارانە تۆمارکردوە .. یەك دوو شەرح و توێژینەوەی کورت بە زمانی (طبری)و یەك دوو کتێب لە شێوەی (نصاب الصبیان) و چەند گۆرانییەك بە دیالێکتە ناوچەیەکانی مەلبەندە جیاوازەکانی ئێران گەیشتۆتە دەست ئێمە ، کە ناتوانین هیچ کامێکیان بە لێکۆلینەوەیەکی ورد و تەواوی. یەکێ لەو دیالێکتە ناوچەییانە دابنێین..ئەگەر ئەوانە بخەینە لاوە ، یەکسەر دەبێ بچینە سەر ئەو لێکۆلینەوانەی کە بێگانەکان کردوویانە . یارمەتێ لەو کارانە وەرگرین ، کە ئەوان لەو بارەیەوە کردوویانە .. ئەو خەلکەی بەو دیالێکتانە قسە دەکەن ، لەبەر بوونی هۆیەکانی هاتوچۆی ئەمرۆ ، لە کونجی گۆشەگیرێ هاتونەتە دەرێ . نەك هەر تەنیا سەر لە شارە گەورەکانی ئێران دەدەن . بەلکو بۆ ولاتانی دراوسێ و ئەورووپا و ئەمەریکایش پێ‌هەلدەگرن.. لادێیی‌یەکی دوورنشین . کە پارەوپولی نیە گەشتی پێ‌بکا ، کە رادیوکەی دەکاتەوە (زمانی ئەدەبی فارسێ) کە لە پایتەخت باوە . دەبیسێ . لادێیی‌یەکی‌تر کە سەروکاری لەگەل دەزگای میریدا هەیە ، نامەکانی خۆی بە زمانی باوی (پایتەخت) دەنوسێ و لەگەل کاربەدەستانیش بەو زمانە (دەدوێ).. رۆژێ نیە کە رێبوار و جیهانگەرێ و فەرمانبەر و پشکنەرەکان و کاربەدەستانی‌تر ، لە مەلبەندەوە نەچنە هەمو ناوچەکانی ئێران و زمانی پایتەخت نەبەنە ئەو ناوچانە .. زۆری پێ‌ناچێ ئەو دیالێکتانە لە ئەنجامی ئەو پەیوەندیانەوە لە بایەخ دەکەون و پاش زەمانێکی کەم ، یەکسەر لەناو دەچن .

ئەرکی ئێمەیە ئەوەی بۆمان دەکرێ ، هەولی کۆکردنەوەی ئەو دیالێکتانە بدەین و لە سەر زار و زمانانەوە بیانهێنینە سەر دەفتەر و کتێب و

له فەوتانی یەکجاری رزگاریان بکەین و رێگایەك بۆ توێژینەوە و لێکۆلینەوەی زمانی فارسی بکەینەوە ... [٢]

تۆسەر تا ئەو جێیەی توانیویتی ، لەو بـارەوە درێغـی نـەکردوە و جاروبارێش یارمەتی لەو کەسانە وەرگرتوە . کە پەیوەندیان بە دیالێکتەکە هەبوە ..

بەرهەنلی لوری . چەند ساڵ لەمەوبەر نامەی دوکتۆرای کاك حەمیدی ئێزدی پەنا بۆ ، ئەو وەختەی کە بە شێوەی نامەبۆ ، نامەیەکی بەرچاو بـۆ ، چونکە بە (امتیاز)ەوە پەسەندکرا .. لەم چەند ساڵەیشدا ، ئەو نامەیە پاراوتر بوە ، تاکو ئەمڕۆ بوە بە کتێبێکی رێكوپێك ..[٣]

وانیە کاك ئێزدی پەنا ، تەنیـا هەر ئەم کتێبـەی هـەبێ ، بەڵـکو لێکۆڵـینەوەیەکی زۆر وردی ، لە بارەی ناوە جوغرافیاکان ، ری و شوێنەکان، گۆرانی و مەتەڵەکانی لوری و دیالێکتی قەرەجەکانی لورستانیشی کردوە .. تۆسەر سەرکەوتنی ئەوان لە خوا داوادەکا ، هیواداره کە ئەم دانراوانـە یەك دوای یەك چاپ بکرێن ..



---

(٢) لوڕ ، وەکو رەچەڵەك کوردن و سـەر بەکوردن یا نا ؟ ئـەمەیان کاری مێژوونوسـە لێهاتوەکانە و کاری یەکێکی وەك من نیە .. ئایا لوڕ خۆیان بە کورد دەزانن یا نا ؟ ئەمەیان کاری برا لوڕەکانە ، چونکە ئەوان باشـتر خۆیان دەناسـن . بەڵام ئایا دیالێکتی لوری بەشێکە لە زمانی بەرگوشادی کوردی یا نا ؟ ئەمەیان مەبەسـتی منە .. !!

(٣) فرهنك لری ( ٢٢ x ١٦ ) سم ـ ١٩٦٤ ـ لە بەرهەمی ( انجمن فرهنگ ایران باسـتان ) کۆکردنەوەی حەمیدی ئێزدی پەنا ـ چاپی فاروس ـ لە خەڵاتی سامانی جەمشیدی یەگانەگی کە بە ئەنجومەنی داوە . یەك هەزار بەرگە کتێبی لێچاپکراوە .

# پێشەکی

ئینجا مامۆستا حەمیدی ئێزدی پەنا ، بە پێشەکییەکی زۆر کورت و خێرا فەرهەنگەکەی خۆی دەکاتەوە و دەڵێ :

« زۆر لە مێژبو ، لە دەرفەتێ دەگەڕام ، تا بتوانم خزمەتێ بە زاد گا ـ زانگە ـ کەی خۆم بکەم ، بەختیارانە کاتێ خوێندنم لە کۆلێجی (الهیات و معارف اسلامی) ئەم دەرفەتەم بۆ پێك هات .. لەسەر ئامۆژگاری و ڕێنوێنییە بە نرخەکانی مامۆستای زانا ، جەنابی دوکتۆر منوچهری ستودە ، نامەی دوکتۆرای خۆم بۆ کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی وشەکانی دیالێکتی لوڕێ و لەکیم تەرخان کرد .. زیاتر لە دوو هەزار وشەی ئەم دوو دیالێکتە کۆکرانەوە و بە شەرحێکی کورتەوە ، لە بارەی باری کۆمەڵایەتێ و جوغرافیایێ لوڕستان وەك نامەی دوکتۆرا پێشکەشی مامۆستای مەزن کرا .. دیسان بە هاندانی ئەوان بە دوای ئەو کارە کەوتم ، تا ئێستا توانیم ئەم کتێبە بە ناوی فەرهەنگی لوڕێ پێشکەش بە هۆگرانی دیالێکتە ئێرانییەکان بکەم .. چەند مەبەستێکی تریش لە بارەی جوغرافیا و ڕێ و شوێن و گۆرانێ و شێعرە ناوچەییەکانی مەڵبەندی لوڕستان کۆکراوەتەوە و ئامادەی چاپن ، هیوادارم بە بڵاوکردنەوەی ئەوان توانیبێتم خزمەتێکی بچووك بە وڵاتە ئازیزەکەم بکەم .

بە دڵ سوپاسی خاتونی پایەبەرز (فەرەنگیز یەگانەگی) سەرۆکی بەڕێزی (انجمن ایران باستان) دەکەم کە خەرجی چاپی ئەم کتێبەی داوە ، هەروا لە ئەندامە بەڕێزەکانی ئەو ئەنجومەنە ، بەتایبەتی دوکتور بهرامی فرەوشی•• زۆر سوپاسی کاک اکبر قطر دریائی و هونەرمەندی لاو کاک موسایيان دەکەم کە لە کاتی چاپکردنی ئەم کتێبە و ئامادەکردنی کلێشەکانیدا هاوکاریان کردم •• جگەرسۆزی و دڵنەوازی هاو شاریە خۆشەویستەکانم و ئەو دۆستانەی کە لەو کارەدا منیان هانداوە ، هەرگیز فەرامۆش ناکرێن [1] •

« داخوا چەند پەسەند دەکرێ و چۆن دێتە بەر چاوان » •



---

(1) هەموو شتێکی لوڕ ، نیشانی بە کوردبوونیان دەکا • زۆربەی زۆری لێکۆڵینەوەکانیش نەیانتوانیوە خۆیان لەم راستیە لادەن بکەن.. کەچی هەندێ رای سەرپێیی هەندێ لە رۆژهەڵاتناس و گەشتوەرەکان هەن ، لوڕ بە کورد نازانن ... سەیر لەوەدا نیە ، کە یەکێکی وەکو نوسکارمان لە ئەنجامی هەندێ مەسەلەی زانستی زمانەوە ، یا لە ناشارەزایی خۆی، یا هەر مەبەستێکی ترەوە بوبێت ، ئەمە بڵێت .. بەڵام کە د. ک. فؤاد عیسان سەریح و را دووبارە دەکاتەوە ، ئەمەیان جێی نیگەرانیە و بەهیچ جۆرە بەڵگەیەکی زانستیەوە بەند نیە.. بڕوانە (زانیاری ــ ٥ ــ ١٩٧٢). هەروەها گۆڤاری کۆڕ (بەرگی دوەم ــ بەشی یەکەم ــ د. جەمال نەبەز) .

# لوڕستـــان

که مامۆستا ئیزدی پەنا . لەو چەند فسانەی دەبێتـەوە ، ئـەوەیش فەرامۆش ناکا کە نوێشکێ لە بارەی لوڕ و لوڕسـتان و ڕێزمانی ئەم دیالێکتە بخاتە بەردەسـت و بڵێ :

« خاکی بەرفراوانی لوڕستان ، کەوتۆتـە ڕۆژنشینی وڵاتی ئێـران و پارچەیەکی یەکجار گرنگی ئەم وڵاتەیە .. وشەی (لر) لە کۆنەکتێبەکاندا بە شێوەی (لوڕ) هاتوە .. خاوەنی (منتخب التواريخ)ی معینێ نـاو ، ئـەم خاکەی بە لوڕی بچوك ناوبردوە .. مەلبەندی لوڕستان شاری (خـوڕەم ئاباد )ە کە قەڵای فلك الافلاکی تێدا کەوتۆتە ئێوەڕاستەوە.. ئەم ناوچەیە هەرچەندیش تا ئەمڕۆ بە باشێ لێی نەکۆڵراوەتەوە بەڵام بایەخێکی یەکجـار زۆری هەیە . چونکە سـەرزەمینی داب و دەزگا و خوورەوشـت و کۆنە زمانی ڕەسـەنە ، قەڵەمڕەوی ئەم زمانە لە سنووری هەمەدانەوە ، تاکو ئەهـواز و خوزستان دەکشێت . بۆنی شوێنەواری چاخی ماد بەڵگەی شارستانێ ئـەم زمانەیە ، کە ئەمڕۆ لە کاتی هەڵکەندندا وەدەردەکەوێ .. سەرچەمی ڕەگ و ماکی وشەی لوڕێ بۆ دێر زەمانە دەگەڕێتەوە .. من بۆ ماوەی پێنج سـاڵ خەریکی کۆکردنەوەی (لوڕێ و لەکێ) بوویم و لە بارەی داب و ڕسومات و ئایین و خوورەوشتی کۆمەڵایەتێ ئەم ناوچەیە ئەرکێـکی فرەم کێشـاوە و سودێکی زۆریشم بەرکەوتوە .. [1] »

---

(١) من لەو بارەڕەدام ، کە ئەم فەرهەنگە زۆر ناتەواوە و هەموو شتێکی سەر بەم دیالێکتەی تێدا تۆمار نەکراوە ...

لە لوڕستاندا ، دوو دیالێکتی سەرەکی بەرگوێ دەکەوێ :

١ـ لــوڕی : کە دیالێکتی مرۆڤەکانی مەلبەند و تا کۆتایی سنووری باشوور و ڕۆژنشین و ڕۆژهەلاتی ئێرانە •

٢ـ لــەکی : کە دانیشتوانی باکووری ئەم ناوچەیە پێی دەدوێن •

لە نێوان ئەم دوو دیالێکتەدا . هەندێ وردە جیاوازی هەیــە کە لــەم فەرهەنگەما دەستنیشانم کردوە ، سەرباری ئەم دووانــەیش شــێوەیەکی‌تر بەناوی (کێوەلی ـ کاولی) هەیە و تایبەتیــە بەو مرۆڤــانەی کە ئێشیــان چاوشی و سازندەییە •• نیــبەت بە وشەکانی لوڕی . من هەوڵێکی زۆرم داوە ، تا لە فارسی نزیکی بکەمەوە . هەرکاتێ کە وشەیەك هاتبێتە بەردەم و بە فارسییەکەی هاوتای ماناکەیم بۆ نەدۆزیبێتەوە ناچار بە چەند عیــارەتێك ڕوونم کردۆتەوە • (٢)



(٢) ئەمەشیان بەلگەیەکی ڕاستەوخۆی • سەرازادی ئەم دیالێکتە کوردییەیە لە فارسی .. بۆ هەمان مەبەست چاوێ بە دوا لاپەڕەی ( لغات محلی ) دیوانی بابا تایەری هەمەدانیدا . بکێڕە .. !

# ئینجـا ..!

هەمو ئەو زانیاریانەی کە تا هەلهاتنی خۆری سەدەی بیستەمیش ، لە بارەی دیالێکت و بنچوە شێوەکانی لوڕەوە ، کۆکرابوەوە . تەنیا (٨٨) وشە بۆ .. ئەمە و سەرباری چوار پارچە شیعری شێوەی ( بەختیاری ) کە «لایاردی» رۆژهەلاتناس دەستنوسی کردبۆن ، جگە لەو (٣٠) وشەیەش کە «هۆتوم سیندلەر» لە بارەی ئەم دیالێکتە پاکنوسی کردبۆن ..

تا ئێستا ، گەلێ لێکۆلینەوەی جۆربەجۆری زانستانەی رۆژهەلاتناسەکانی وەکو ( مالکۆلم ـ هازل ـ لێری ـ لیرخ ـ براون ) بە قەناعەتێکی مەوزوعییەوە . کوردایەتی لوز و یەکێتی بنەچەکیان لەگەل کوردا ئامێتە دەکەن .. سپایزەری پرۆفیسۆر لەو باوەڕەدایە . ئەو میللەتەی (لولو) ناو . کە لە ناوچەی زەهاو و شارەزۆر و سلێمانیدا دەژیا ، بنەچەك و باو و باپیرانی لوڕی ئێستان ..[1]

ئەو تۆژینەوەیەی کە دوکتۆر فریج لە بەرلین بە چاپی گەیاندوە دەلێ : « لوڕ بەشێکن لە کوردی ئێران ، کوردەکانی ئەم ولاتە ـ لە زۆی زمانەوە ـ دو بەرەبابی گەورەن . چ ئەوانەی بە کوردی موکریانی و کرمانجی سەرو دەئاخفن . چ ئەوانەی بە کوردی لوڕی دەدوێن .. جگە لەو پەیوەندیە بتەوانەی کە لە نێوان ئەم دو بەرەبابەدا رەگی داکوتاوە ، گەلێ

---

[1] بەشی هەرە زۆری ئەم زانیاریانە لە ( گوڤاری کۆڕ ـ بەرگی دوەم ـ بەشی دوەم ـ اللروالڕستان ـ علی سیدو گورانی ) هەلێنجراوە .

پەیوەندیی دیکەش ، هەر لە خووڕەوشت و نەریتەوە بگرە ، تا سایکۆلۆژیەتی هاوکۆیان ، هەر زۆر زەق و دیارە ... [2]

سەرەڕای ئەمەیش ، گەلێ لەو لێکۆڵینەوانەی کە لە ڕۆژهەڵات خۆیدا نوسراوەتەوە ، پەنجەنمای ئەم ڕاستییە دەکەن ، لە بەرگی یەك و دوّی تۆژینەوەی فیلۆلۆژیای ئێران (١٨٩٨ ــ ١٩٠٠)دا هاتوە و دەڵێ « نزیکی و پەندیوارییەکی یەکجار بەتین لە نێوانی لوڕی و کوردیدا هەیە . بە چەشنێ دەتوانین ڕاستە و ڕاست بڵێین : ئەم لوڕییە بەشێکە لە زمانی کوردی ... »[3]

مێژوونوسی گەورەی عوسمانلی (احمد جودت) و هەروا (ریچ)ی ئینگلیزیش لەو باوەڕەدان کە : «لوڕ و بەختیاری و لەك و گۆران بەشێکن لە نەتەوەی کورد ...» بەرگی پێنجەمی ژمارە (٣٤)ی ئینسیکلوپیدیای تورکیش ، ئەوەی فەرامۆش نەکردوە کە : « هەندێ زمانزان لەو بڕوایەدان ، کە دیالێکتی لوڕی و بەختیاری ، سەر بە زمانی کوردیە. ئەم دوو دیالێکتەیش، پتر لە گرۆپی کوردیی باشوورەوە نزیکترە ، تا گرۆپێکی دیکە ... »[4]



ئەم زمانەی ئێمە ، کە نیشانەی ڕەسەنایەتی و بیرکردنەوە و سازەی پشتی نەتەوەکەمانە ، بەشێکە لە زمانە ئێرانیە ڕۆژاواییەکان ، کە تا بە

---

(٢) بەڕای من ئەمە فەرهەنگێکی سەربەخۆ نیە ، بەڵکو بەشێکە لە دیالێکتەکانی زمانی دایك و بۆ باشەزۆری فەرهەنگێکی لێکڕای کوردی سودێکی فرەی لێ وەردەگیری .

(٣) وشەی ( لوڕ ) هەروەکو دانەری کتێبی ( بەرگوزیدە )ی فارسی دەڵێ . ماناکەی بە کوردی ( شاخی بڕچڕە دارستان ) دەگەیەنێ .

(٤) هەروەك چوّن لای ئێمە ــ کوردستانی عیراق ــ و دەور و بەریدا زۆربەی دیالێکتەکان خۆیان دەنوێنن ، لەناوایش لە ئێرانا و هەر یەکە لەسەر بارچە خاکێکا جێنشینن .

رۆژی ئەمڕۆیش دەگا . هەر بە زیندوویی و هەر سەربەخۆ ماوەتەوە و هەموو خاسیەتی سەربەستانەی خۆی لە تەك خۆیا هەلگرتوە و لە رووی لیکسیکۆلۆژی و واتاناسی و ئەتیمۆلۆژی و فریزیۆلۆژی و فەرهەنگ و فیلۆلۆژیایش . قەوارەیەکی سەربەخۆی هەیە [٥] و زانستی هاوچەرخانەی زمانیش ، بەوپەڕی شانازییەوە . لە بەردەم ئەم راستیەدا لەنگەر دەگری و هەرومك چۆن دیراساتی ورد و جۆراوجۆری ئەم دوایە ئەمەی ساغ کردۆتەوە .

تا ئێستا گەلێ لەو نەخشانەیش کە بۆ گرووپی دیالێکتە جیاجیاکانی زمانی کوردی کراوە و هەریەکەیان بە چەشنی دابەشکراون ، هاوسەنگی و رەسەنایەتی و یەکێتی ئەم زمانەمان بۆ وەدەردەخەن و پەردە رەشەکان سەرەنداز دەکەنەوە ... نزیکەی (٤٠٠) سالی بەر لە ئەمڕۆ شەرەفنامەی بەدلیسی ئەم زمانەی کردوە بە چوار بەشی مەزن : (کرمانج ـ لوڕ ـ کەلهوڕ ـ گۆران) مینۆرسکی و تۆفیق وەهبی و ئەمین زەکی و مەکەنزی و کوردۆییف . هەریەك بە چەشنی .. دوکتۆر کمال فۆاد و شیخ محمدی خال و دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف و دوکتۆر عزالدین رەسول و دوکتۆر امین موتابچی و گەلێکی دیکە لەم مەسەلەیە دوواون .. دابەشکردنەکەی لیژنەی لێکۆلینەوەی زمانیش ـ لە کۆڕی زانیاری کورد ـ بە پێی نەخشەیەکی جوغرافیاییەوە ، کردوویتی بە سێ بەش ( زارەکانی سەروو ـ زارەکانی ناوەڕاست ـ زارەکانی خواروو ) کە من بەلامەوە ئەمەیان ـ لەبەر گەلێ شت ـ زۆر دلگیرتر و سەرپەرزترە .. [٦]

---

(٥) بڕوانە ( وشەی زمانی کوردی ـ دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ـ ) هەروا ( فۆنەتیکی زمانی کوردی ـ محمد امین هەورامانی ) .

(٦) ئێمە کە دەلێین ـ لە رووی جوغرافیا و مێژوووەوە ـ (لوڕستان) مەبەستمان لەوە پتر نیە گەر بلێین ( موکریان ) یا ( سۆران ) یا ( بۆتان ) یا ( ئەردەلان ) ... تاد

بێگومان زۆری دیالێکتەکانی کوردی ، مانای ئەوە نیە ، کە ئەم کوردە میللەتێکی پچڕپچڕ و بێ سەروبەر و زمانێکی پێتوك و سەربەخۆی نیە ، چونکیم دیاردەی (دیالێکت) لە هەر زمانێکا و لەبار ڕۆشنایی بەخشتەکانی دەستوری زانستی زماندا ، دیاردەیەکی مێژویی و شارستانییە و چ دەخلێکی ئەوتۆی بە بون و مان و یەکێتی نەتەوەوە نیە .. دیالێکت لەبەر ڕۆشنایی زانستدا ئەو کۆمەلە خاسیەتەی زمانە کە سەر بە دەور و پشتێکی تایبەتیە . ئەو دەور و پشتەش بەشێکە لە دەور و بەرێکی فراوانتر و تێکڕاتر کە ئەنجا دیالێکتە جۆراوجۆرەکان دەگرێتە خۆی .. پەیوەندی نێوان زمان و دیالێکت وەکو پەیوەندی نێوان (گشتیە بە تایبەتی) و (دایکە بە ڕۆڵەکەی).. «ئەو خاسیەتەی کە شێوە زمانێك لە یەکێکیتر ــ تا ڕادەیی ــ جیا دەکاتەوە، بەندە بە دەنگ و بە جۆری دەربڕینی ئەو دەنگ و بە جۆری گۆ کردنی مۆسیقایی و بە یاساکانی ئاوێتەبون و عەملاندنی نێوان دەنگە هاوچەشنەکان . وایش دەبێ جیاوازییەکە لە ڕوی مۆرفۆلۆژی و سەنتێکسیتەوە ڕوبدات»[٧] بەلام هەمو دیالێکتەکان لە زۆربەی زۆرینەی کۆنە وشە و ماناکاندا یەکن . هەروەکو چۆن لە جۆری داڕشتنی ڕستە و لە ڕاناو و ژمارە و ناوی نیشانە و پەیوەندی و ئامرازی پەیوەندی نێوان ڕستەکاندا یەکن .. تاد .

بە بارێکیتر « دیالێکت جۆرێکی تایبەتی ئاخاوتنە ، کە کۆمەلە مرۆڤێکی نێو ناوچەیەکی دیاریکراو بە کاری دەهێنن و لە ئەنجامی چەند دەساوێژێکی تایبەتیەوەیش سەر هەلدەدا »[٨] وەکو : لێكخشانی زمانی ، بە چەند زمانێکی دیکە و پێکەوە ترشان و تێکچڕژانیان ؛ هەروا بەرگوشادی ڕوپێوی خاك و دواکەوتنی هۆی هاتوچۆکردن و بە یەك گەیشتن[٩] سەرباری ئەو

---

(٧) بڕوانە نێتیس ــ علم النفس اللغوی ــ دوکتۆر نوال محمد .
(٨) بڕوانە نێتیس ــ مقدمة في علم اللغة ــ دوکتور محمود السعران .
(٩) دیالێکتی لەك و لوڕ ، لە گۆکردن و فۆنێتیك دەربڕینا جیاوازی لەگەل

جیاوازیانەی کە لە نێوان تاك و تاکێکا هـەیە ، چ لە گۆکردن و جـۆری دەنگ و دەستەواژەکانی و چ لە هەلکەوتنی ژنیەکانی قورگدا •• سەرەڕای ئەوەیش هەرچەندە ، پەیوەندیە مەعنـەوێ و کۆمـەلایەتیـەکانی نێـو کۆمەلگایەکی نێو یەك تاقە نیشتمان ، شـیرازەی بپچڕێ ، دەهـا پتـر دیالێکتەکانی زاوزێ دەکەن و لق و پەل و پۆ دەردەدەن و جیـاوازێ لـە نێوانیا پەیدا دەبێ . ئەمە و جگە لەمەیش هەرچەند زمان لە (نیشتمانی دایك) دوورکەوێتەوە و ئاوارە بێ ، ئەوەندە دەبێتە مایەی پەیدابوونی بێچوە زمـالی جۆراوجۆر •• لەبەر رۆشنایێ ئەم راستیانەشدا ، مەزنترین دیاردەیەکی نێو زمانـزمانی زندوـ دیالێکتی (ناوچەیێ)یە کە بە مەسەلەی هەرێمایەتێ و جوغرافیاییەوە بەندە •• هەروەکو چۆن لە نێوان لەهجە جیاجیاکانی سوریا و جەزایر و عەدەندا هەیە. هەروەك چۆن لە نێوانی شێوە زمانی بەغدا و چایشا بەدی دەکرێ « هەروەکو چۆن لە شێوە زمـانەکانی ئینگلیزێ لەلـەدەن و کۆرویل و واشنتەن و ئوسـترالیا و باشوری ئەفەریقیادا هەیە [10] هەمـان شتیش لە زمانی کوردێ ناوچەکانی دیاربەکر و سلێمانێ و کرمانشادا هەیە و دیـارە •••

بێگومان دیالێکت لە ئەنجامی هەندێ هۆی چینایەتێ و کۆمەلایەتیـەوە گۆڕانی بە سەرا دێ و جۆری ئاخاوتنی دەگۆڕێ•بۆ نمونـە : قسـەی ـ لەهجەی ـ رۆشنبیران غەیری قسەی مەلا و کاسبکـار و جوتیـارانە «قسەی قوتابیانی زانستگەی ئۆکسفۆرد غەیری قسەی کامبوردگە»[11] بەلام لە ئاخاوتن و جۆری وشە و تەرکیبی دەستەواژە دەربڕینا یەکن •[12]

---

دیالێکتەکانی تردا هەیـە ، کە لە ئـەنجامی گەلێ هـۆی شارستانێ ـ سیاسێ و رۆشنبیرێ ـ و جوغرافییەوە کەوتۆتەوە .

(۱۰) گۆڤاری الادیب المعاصر ـ ژ ۱۳ ـ دوکتۆر صالح مهدی ـ ۱۹۷۵ .

(۱۱) هەمـان سـەرچاوە .

(۱۲) سـەرەڕای ئەوەیش زۆر بە دەگمەن رێك دەکەوێ ، دوکەس هەبێ وەکو

تا ئێستا بۆ ئەم مەسەلەیە گەلێ پیلەی توند و تیژسازدراوە ، سەرەڕای ئەمەیش (کات) دەورێکی دیاری تێدا دەبینێ ، چونکە هەر کۆمەڵێ لەکات و زەمانەیەکی دیاریکراوا ، جۆرە ــ ئاخاوتنێکی ــ هەیە و لە ئەوەی پێش خۆی و دوای خۆی بەدەرە ، بۆ نموونە : زۆر وشەی کۆنی کوردیی . لە کاتی خۆیدا بە جۆرێ گۆدەکرا . ئێستا بە چەشنێکی دیکە .. بێگومان زمانی کەلە شاعیرێکی وەکو ( نالی ) لە زمانی ( گۆران )ی شاعیر جیایە .. گەلێ لەو وشە و دەستەواژانەش کە لە کاتی خۆیدا ، جۆرە مانایەکی هەبوو ، ئێستا یا بە تەواوی فەوتاوە ، یا رەنگی مانایەکی تر دەدەنەوە .. بەڵام دەبێ ئەوە هەڵنەبوێردرێ کە : مەسەلەی رێزمان گشتیان بەیەکەوە دەلکێنێ ، چونکە خاسیەتێکی نەگۆڕاو و درێژخایەنی هەیە .. هەر بەم پێیە و بەپێی ئەم فەرهەنگە و بەپێی رێزمانەکەی ، ئەوا دیاردە و پەیوەندییەکانی مێژوویی و فیزیۆلۆگی و جوغرافی و سایکۆ کۆمەڵایەتییەوە ، ئەم دیالێکتە دەکا بە بەشێکی هەرە دیاری زمانی زیندووی کوردیی ..

ئەمەیان وا ، هەر لەگەڵ داهاتنی چەرخی تیکنۆلۆژیاش . گەلێ وشە و زاراوەی سەر بە زانستەکانی پزیشکی و ئاسمانەوانی و ئابووری و پیشەسازی و داهێنان و هونەر .. تاد . هاتۆتە نێو زمانەوە .. بێگومان هیچ زمانێکیش ــ تا بە دیالێکتەکانیشی دەگا ــ لەم سەرزەمینەدا نیە لە مەسەلەی «دان و وەرگرتن» لاتەراز بێت ، تەنیا ئاوڕدانەوەیەك لە شێوەی سلێمانی ــ کۆن و ئەمڕۆ ــ دەنگەیەتێتە گەلێ سەرەنجامی ورد و بەتام و سەیرەوە... « ئێمە دەڵێین ، شێوە زمانی خەلکی ڤینیسیا جیایەکی تەواوی لەگەڵ زاری خەلکی سەقلیەدا هەیە ، کە هەردوکیان سەر بە زمانی ئیتالیایین.

---

یەك ، هەموو وشەیەك و رستەیەك گۆ بکەن یا دەریبڕن ، لەمیش لە ئەنجامی نوتین و پلەی خوێندەواری و هۆشمەندی و ئەندێشەو و جۆرێتی دورستبوونی ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە .

هەمان شتیش بۆ پرۆتێسیایی و فەرەنسایی کە لە بنجا لە یەك زمان کەوتونەتەوە ، هەمان دیاردەیش لە شێوەی وێلز و بیرکشایری باشوری ئینگلستان و کورویلی باشوری رۆژاوا و شێوەی لەندەن »[١٣]

جا ئەگەر ئەمە حالی هەمو زمانێکی زیندوی لەبەر چاوی ئەم جیهانە بێت ، دە ئەوا هەمان شت لە نێو زمانی ئێمەشدا دوبارە دەبێتەوە ، هەروەك چۆن لەم فەرهەنگ و باسەدا خۆی دەنوێنێ ، کە لە بارەی دیالێکتی (لوڕ)ەوەیە[١٤]



لوڕی ئەمڕۆ ، بریتییە لە چواربەش : ( مامەسەنی ــ کیوەگیلو ــ بەختیاری ــ لوڕی ئەسڵ )[١٥] .

١ ــ خێڵەکانی مامەسەنی بریتین لە : ( رۆستەم ــ بەکش ــ جاوی ــ دوژمن زیاری ) .

٢ ــ خێڵەکانی کیوەگیلو بریتین لە : ( بەهمی ــ بەهرەمەدی ــ تیبی ــ بوێر ــ نووی ــ گوروم ــ باوی ــ شێرئەلی ــ یوسفی ــ شارویی ــ ئەهمەدی ــ تیلەکوێی ــ ئەوشار ... تاد

٣ ــ خێڵەکانی بەختیاری ــ لوڕستانی بزورگ ــ بریتین لە : ( چارلنگ ــ هەفت لنگ ) .

---

(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشو .

(١٤) دیالێکتی سلێمانی ، لەم ماوە درێژەی بەخششی بەجەرگانەیدا دەوری خۆی زۆر بە کارامەیی بینیوە و تا رادەیەکیش پوکاوەتەوە ، بۆیە دەبێ لەژێر سایە و بەخششی ئەم دیالێکتە رەوانەدا ،زۆر زانایانە و شاعیرانە و پسپۆڕانە بە وشە و فرێزی دیالێکتەکانی تر موتوربە بکرێت تا زمانی ستاندارتمان بتر رەگ دابکوتێ و بزاخێ . !

(١٥) لەوانەیە لەگەڵ برایەکی لوڕ ، لەیەك حالی بون توزێ زەحمەت بێ ــ لە قسەکردنا ــ بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە سەرتا بە پای فەرهەنگی ئەم دیالێکتە سەر بە زمانی کورد نیە ، هەروەکو چۆن لێرەدا نیشان دراوە.

٤ ــ خێڵەکانی لوڕی ئەسڵ ــ فەیلی ــ بریتین لــە : ( دلفان ــ ئامیلە ــ سیلە سیلە ــ بالاگریوە ) :

ئا ــ ( دلفان ) بریتییە لەم لقانە : ( کالەوەند ــ تیوەتەند ــ مومنە ــ ریشەوەند ــ بەخبەوەند ــ چوارق ) •

ب ــ (ئامیلە) بریتییە لە : (کوشکی ــ زیودار ــ فاترچی ــ ئومەرابی ــ میراخوڕ ) •

ح ــ ( سیلە سیلە ) بریتییە لە : (حەسەنەوەند ــ قولیوەند ــ یوسوەند)

د ــ ( بالاگریوە ) بریتییە لــە : ( پاپی ــ رەشــتو ــ ســاکی ــ دیرکەوەند ) •

سەرەڕای ئەم خێڵەساتانەش ، هەر لە باکوری لوڕســتاندا ناوچەیێ هەیە ( لەکستان ) و خێڵەکانی ( لەك )ی تیدا جێنشینە و بریتین لەم لقانە : (زەمد ــ مافی ــ باجەلان ــ تەزحان ــ سەلسەلە ــ دەلوەند ــ زەندەگێلی) کە شێوەی زمانیان لە کوردییە ستاندارتەکە نزیکترە تا لوڕ [١٦] •• جگە لەمەیش لە نێو فەیلییەکانی لوڕســتانی بچوکدا ، گەلێ خێڵی پەراگەندەی کوردی وەکو : ( مەهکی ــ هلێلان ــ شوان ) هەن • لە نێو عەشیرەتەکانی لوڕستاندا ، کەلەپورێکی یەکجار بــە نرخ و رەوان . لە چیرۆکە شــیعر و فۆلکلۆر و گۆرانی و حیکایەت و داستانی شیعرییانە هەیە •• لەوانەی کە هەر لە کۆنی کۆنەوەیش بەم دیالێکتە شیعریان چڕاندبێ : ( مەلا پەریشان ــ بابە تایەری هەمەدانی ــ حسێن قولی خان ــ نەجە مامەسێنی ــ دەفتەری ــ فەیزی ــ ئیزدی ــ عەلی ئەسغەری نەهاوەند ــ شێخ خەلیلەکبەر ــ غولام

---

(١٦) بە ئەند نزیکی کرمانجی ژۆرو ، لوڕ لە ستاندارتەکە نزیکە .. خۆ کەسی کەمبینای وایش نیە بتوانێ بلێ : کرمانجی ژۆرو شالقێکی یەکجار مەزن و جەلەنگی کوردی نیــە ...

رەزا ــ میرنەورۆز ــ خانەمەنسور ــ شاکە ــ مەلا شەفیی ــ مەلا نەوشاد ــ نوزەکولینی ــ خەلەکە ــ بالــە ــ تاد [١٧] .. خۆ ئــەگەر بکرێ بەڕای هەندێ مێژوونوس و میتۆلۆژیست و کوردناس و لوڕناسەکان ، شێوە زمانی ( گۆران )یش سەر بە دیالێکتی لوڕ بێ ، ئەوا بێگومان بەخشش و بەرهەمی ئەم دیالێکتە ، هیچی لــە دیالێکتەکانی دیکەی کوردیی کەمتر نیــە ، گەر دەسڕۆتر نەبێ ، وەکو : ( تۆبادیی ــ مەولەویی ــ کۆماسیی ــ سەیدیی ــ وەلیدیوانە ــ و گەلێکی تر ...

ئەوەی لێرەدا دەبێ بخرێتە بەر چاوان ئەوەیە کە دیالێکتی لوڕ ، لە ڕۆژی ئەمڕۆیدا دەبێ بە :

١ ــ دیالێکتی لوڕیی گەورە کە : ( مامەسێنی ــ کێوەگیلو ــ بەختیاریی ) دەگرێتە خۆی [١٨] .

٢ ــ دیالێکتی لوڕیی بچوك کە سەرتاپای وڵاتی فەیلی یا پشتکۆ بە خۆیەوە دەگرێت [١٩] .

---

(١٧) بڕوانە کتێبی ( الاکراد الفیلیون في التاريخ ) ــ محمد توفيق وردي .

(١٨) تیرەی ڕواو ــ ڕێبوار ــ یا (مەلخەتاوی) کــە بە پــەرش و بــڵاوی لــە دەوروبەری کوت و ئابادان و بەدرە و جەســـــان و دیــالە و حیللــە و نەعمانیە و موســەیەب و کوفە و خوزەمشەهر و ئەهوازدا دەژین ، بــە شێوەیەك دەدوێن هەم کورد و هەم عەرەب لێیان تێدەگا ، وەك :

کوشتنەم : کتلونی
سەرم بڕین : ذبحونی

یانە وەکو :

یا شێخ یــا شێخ یــا ( توزمــال )
یــەك توشم هــات ( فد رجــال ) . . . تاد

بەڵام کە لەگەڵ عەرەبێکا قسە دەکەن ، ئەوا بە عەرەبی و وەکو ئەوان ، کەچی لە نێو خۆیانا بەم شێوەیە دەدوێن .. !!

(١٩) بڕوانە قاموسی زمانی کوردیی ــ ل ٤٣ ــ ٤٤ ــ عبدالرحمن زەبیحی .

ئەم فەرهەنگەیش ، سەرەڕای ئەوەی بەربەرچدانەوەیەکی مەیدانی ــ کەم تا زۆر ــ زانستانەیە ، لە هەمان کاتیشا راستی قسە و بۆچوون و بیروڕا و گۆشە نیگای رۆژهەڵاتناس و کوردناس و زاناکان دەسەلمێنێ و پەردە لە سەر کونجێکی دیکەی تاریك و نوتەکی ئەم مەسەلەیە هەڵدەداتەوە ..

بە دووریشی نازانم یەکێکی تری بۆ هەلکەوێ و لایەنەکانی دیکەی ئەم دیالێکتە و پەیوەندی بە دیالێکتەکانی دیکەی کوردی سەنگ و سوژن و دیراسە بکات [20] ..

بێگومان مەبەستی بەر و دوای منیش لەم هەوڵەدا ، هەم بەربەرچدانەوەی ( انجمن ایران باستان )ە و هەم ساغکردنەوەی نەژاد و رەچەڵەکی کوردانەی ئەم تیرە و هۆزانەی لوڕستانە ، دیارە زمانەکەش ــ دیالێکتەکە ــ باشترین بەڵگەیەکە .

ئێمە میللەتێکین ، پێداویستیەکی زۆرمان بە خۆناسین و خۆناساندن هەیە ، دوور نیە خەمی ئێمە لە خەمی خەڵکیتر زاخدراوتر بێ . خۆ ئەگەر لەمەولا ئێمەش بێین بە خەمکی خەمانی خۆمان ، ئەوا بە راستی : لە نەلسەنەی ژانی قووڵ و پاك و مرۆڤانە لامان نەداوە .

**محمود زامدار**

**بەغدا ــ هەولێر ــ زستانی ــ ١٩٧٧**

---

(٢٠) زۆر هەوڵم دا ، لوڕێکی شارەزا بدۆزمەوە ، تا کولك و مۆی هەندێ پرسیار و سەرنج دەها باشتر لە یەك دابڕیکەم .. رۆم لە یەك دوو کەس کرد ، بەڵام لە بەر زۆری (کار) یان نەیان بەرژایە سەر ئەم (کار)ەی کە لە گشت (کاری) کاریکەرتر و نەمرترە .

# ـ ئا* ـ

| لوڕی | کرمانجی خوارو | فارسی |
|---|---|---|
| **ئابادی** | چادرنشین . ئاوەدانی | روستا . چند چادر سیاه روستائی گرد هم . |
| **ئاپارتی** | میلباز | حقەباز . شیاد . |
| **ئاتشەك** | ئاتەشی . سەلس ، ئاگرە. | بیماری سفلیس . |
| **ئاخرسەر** | سەرەنجام . کۆتایی | سرانجام‌کار . عاقبت . |
| **ئاخۆن** | ئاخۆن . ئاخوند | آخوند . طبقه روحانی . |
| **ئاردبەهرە** | مزەی ئاش ، ئاردەبارە | مقدار آردیکه آسیابان پس از اردکردن گندم یا جو . بابت انعام میگیرد . |
| **ئارد زرشك** | بزوش . بزویش | سریش |
| **ئاردلۆ** | ئارددلان | جائی در اسیاب که ارد از میان دو سنگ در آن میریزد . |
| **ئاردیز** | ئاردژیژ | نوعی الك است که تور آن از میباشدو این نوع الكرا کولیها درست میکنند و برای بیختن ارد و چیزهای مشانه ان مورد استعمال دارد . |
| **ئارم** | هێمن . ئارام . ئۆقرە | اهسته . آرام . |
| **ئارو** | چەناگە | اروارە . لنه . |
| **ئاروبالا** | لاشەویلاك . شەویلکە | اروارە بالا . لنه بالا . |
| **ئاروهار** | مەلازۆ . مەلازك | اروارە پائین . لنه پائین . |
| **ئاروغ** | قزتینە | هوا و گاز معده که با صدا از دهان بیرون آید . |

(*) بێگومان ئەم جۆرە دەنگانەش کە لە جیهازی قوڕگەوە دەردەچن ( ئە ـ ئۆ ـ ئێ ـ ئو ـ ئی ) لەم شێوە زمانەدا هەیە . . . ! .

| | |
|---|---|
| **ئاز** : هێز ، توانا ، هەزەت | نیرو و توانائی جسمی . |
| **ئازا** : نازا ، ساغ ، بەهێز | سالم ، بی عیب ، بهبودی . |
| **ئازابیە** : ساغبووە ، بەهێز بوە | بهبودی یافتن . |
| **ئازاکردە** : ئازادکردن ، چارەکردن | معالجەکردن مریض . |
| **ئازکە** : جۆرە چێشتێکە کە لە گیایەك کە ناوی ئازیکەیە و هەویرترش دوروست دەکرا . | نوعی آش کە سابقا از گیاهی صحرائی . بە این نام و خمیرمایە درست میکردند و ترش‌مزە بودەاست . |
| **ئازگار** : یەك دوای یەك | پیاپی . |
| **ئازلی** : یەکسەر ، زۆبەزۆ | فورا . |
| **ئاژ** : رۆی‌کلاش | نوعی دوخت . نوعی تخت گیوەاست . آژیە . |
| **ئاژناژکی** : باوێشك | خمیازە . |
| **ئاژناژکی‌کردە** : باوێشکدان | خمیازە کشیدن . |
| **ئاسارە** : هەسارە ، ئەستێرە | ستارە . |
| **ئاسەر** : ناواخن ، ئەستار | آستر . |
| **ئاسمۆ** : ئاسمان | اسمان . |
| **ئاسمۆغرمە** : گرمەی هەور | تندر . رعد . |
| **ئاشیر** : شەنە و شەغرە | وسیلە ایکە خرمن کوبیدەرا با آن باد میدهند . |
| **ئاغل** : ئاخەل | محلی کە گوسفندان‌را در آن جای میدهند . |
| **ئافرەت** : ئافرەت . ژن | صفی‌است کە برای زن بیوە تهیدست و بیچارە بکارمیرود . |
| **ئافەرێ** : ئافەرین | آفرین . |
| **ئافەریە** : خولقاندن | آفریدن . |
| **ئاکلە** : ئاگرە . سوسەنەکێ | سفلیس . |
| **ئاگول** : مێل ، ئەلەکە | حقە . نیرنگ . |
| **ئالاکو** : جۆرە ئامرازێکی ئاسنینی دەسکدارە کە بۆ بژارکردن بەکاردێت . | وسیلەایکە از آهن درست شدەاست و دستە چوبی دارد و با آن و جین میکنند و علف‌های هرزەرا از زراعت برمیکنند . |
| **ئالەت** : بیبەر . ئالەت | فلفل . |
| **ئالەت‌فرەنگی** : بیبەری سەوز | فلفل سبز . |
| **ئالەنگ** : بەڕەللا | ولگرد . |

| | |
|---|---|
| **ئالشتکرده** : گۆڕین . ئالشــت ، بژاردن | عوض‌کردن . |
| **ئالونملا** : خانوچکه | چار دیواری موقتی که معمــولا برای کــانیکه از بوستان یا زراعــت نگهبانی میکند میــازند . |
| **ئاماده** : ئاماده | حاضر . آماده . |
| **ئاموخته** : ئامیته . ئیکه‌لاو | اموخته . عادت‌کرده . |
| **ئاهویر** : ئاخوڕ | اخــور . |
| **ئاهن‌روا** : ئاســکێش . موقناتیز | اهن‌ربا . |
| **ئاهه** : ئاسن | اهــن . |
| **ئایم** : ئادەم | ادم . (۱) |
| **ئایم‌هەرەك** : ئادەمی خۆر ، بنیادەم خۆر | ادم خوار . جــانور وحشــی آدم خوار . |
| **ئایمی‌زاد** : ئادەمیزاد | آدمی زاد . |
| **ئایمی‌زایە** : ئادەمیزاده | آدمی زاده . |
| **ئایینه** : ئاوێنه | اینــه . |
| **ئـه** : ئا . بەلێ . ده | اگر . حرف شرط . بلی . آری . |
| **ئەبلەق** : ئەبلەق . رەش‌وسپی | سیاه و سفید . دوبین . |
| **ئوجاغ** : وەجاخ . نەوه . میراتگر | اجاق . فرزند و وارث . |

---

(۱) وەکو دیاردەیەکی ئەم زمانە فراوانەی ئێمە و له سەرانسەری دیالێکته جۆێ جۆێ‌کاندا گەلێ له پیتەکان دەگۆڕێن و جێ‌گۆڕکێ دەکەن ، یا هەر فڕێ دەدرێن . هەروەك چۆن له لوڕیدا دیاره :

(ی) دەبێ به (د) یا به (و)
(د) " " (گ) یا (ی) یا (ت)
(ل) " (ر)
(غ) " (ق) یا به (گ)
(ق) " " (غ)
(و) " " (ب)
(ئه) " " (گ)
(ح) " " (خ)
(خ) " " (ق) یا (غ) یا (خ)
(و) " " (م)
(ج) " " (گ)
(ژ) " " (ش) ... ئاد

| | |
|---|---|
| **ئوجاغ‌کور** : وەجاخ‌کوێر | کسیکه فرزند و عقبه ندارد یا فرزند دارد و نااهل است یا فرزند نرینه ندارد . |
| **ئەچی ؟** : ئەی . ئەموا | پس چه ؟ |
| **ئەخم** : گرژبوون . ڕوترش | ترشروئی . |
| **ئەخم‌وتەخم‌کردە** : خۆگرژکردن | ترشروئی‌کردن . |
| **ئەر** : ئاگر . ئاور | آگر . |
| **ئوبر** : هەور | ابر |
| **ئرامێ** : بوخچەی حەمام | نوعی بافتنی‌است مانند سجاده که معمولا وسایل‌حمام‌را در آن پیچند . |
| **ئەرجە** : زەردەڵو | درخت زردآلوی کوهی . |
| **ئەردەنگ** : شەق | اردنگ . |
| **ئاردە** : ئارد کونجی | کنجد کوبیده شده که روغن آن گرفته نشده‌است . |
| **ئەرزو** : هەرزان | ارزان . |
| **ئەرزوبییە** : هەرزان‌بوە | ارزان شدن . |
| **ئەرزونێ** : هەرزانێ | ارزانی . نام شخص هم هست . |
| **ئورسێ** : کەوش . دەرگای دۆلاێ | کفش . درهای‌کشوئی جلو اطاق . |
| **ئرشت** : هێرش . ابۆسەگ) | حمله . یورش . |
| **ئیرشت ئووردە** : هێرش‌بردنی سەگ | حمله‌کردن . معمولا حمله سگ هاررا گویند . |
| **ئەرغوو** : دار و گوڵە ئەرخەوان | درخت‌یا گل ارغوان . |
| **ئەرغوێ** : ئەرخەوانێ | رنگ ارغوانی . |
| **ئەرمنی** : ئەرمەنێ | ارمنی . مسیحی مذهب . |
| **ئەروو** : دۆست . ئەرباب | ارباب . |
| **ئەزگە** : پشکۆ . پەنگر . ئەسکل . | دانه آتش سرخ شده و گداخته . گل آتش . |
| **ئویژدیها** : ئەژدیها | اژدها . |
| **ئسپار** : رنو . هەرەس | هرس . |
| **ئسپارکردە** : هەرەس‌هێنان | هرس‌کرده . (۲) |

(۲) لە لوڕیدا بێر فەرمان بەکار دەهێنرێ . کەچێ لە سناندارتا چاوگ : «پێشوازێ‌کردە ، پێشوازێ‌کردن» .

| کوردی | فارسی |
| --- | --- |
| **ئسبینه ترموغ** : سپێنەی هێلکە | سفیده تخم مرغ . |
| **ئسبیل** : سپڵ | طحال . سپرز . |
| **ئسبیو** : سپی‌باو | سفیدآب . |
| **ئسپناج** : سپێناخ | اسفناج . |
| **ئەسی** : ئەسرین . فرمێسك | اشك . |
| **ئسکنه** : ئەسکەنە | یکی از نزارهای درود گری‌است . |
| **ئسوەن** : ئەسپۆن | اسپند . |
| **ئەسیوو** : ئاسیار | آسیاب . |
| **ئسی** : ستوندە . کۆلەکەی چادر | ستونی که عشایر زیر چادر سیاه میزنند . |
| **ئشکار** : ڕاو . شکار | شکار . هر نوع شکار کوهی‌را گویند . |
| **ئیشکەفت** : ئەشکەوت . ئەشکەفت | غار . شکاف‌کوه . |
| **ئشنەفتە** : زنەفتن . بیستن | شنیدن . |
| **ئشکیل** : کەموکوڕی . خەوشدار | عیب و نقص . |
| **ئوێتێ** : ئوتێ | اطو . |
| **ئوێتێ‌کردە** : ئوتێ‌کردن | اطو کشیدن . |
| **ئفتومنە** : کەم‌بونەوە | کم شدن و نقصان یافتن چیزی . |
| **ئەفتوو** : هەتاو | آفتاب . خورشید . |
| **ئەفتووسوختە** : تاوبردوێ | آفتاب زدگی . آفتاب سوختگی . |
| **ئەفتووگیرسە** : هەتاوگیران . ڕۆژگیران | کسوف . آفتاب گرفتن . |
| **ئەفتوەلگە** : مەسینە و لەگەن | آفتابه‌لگن . |
| **ئەفرا** : جۆرە دارێکە | نامی درختی‌است . |
| **ئفلیج** : گۆج . گێژوگەوار . ئیفلیج | افلیج . زمینگیر . |
| **ئەقد** : ئەد . بەقەد . ئەندازە | اندازه . |
| **ئوقە** : ئەوەندە | آنقدر . |
| **ئلابور** : کۆتری ڕەش‌وسپی | کبوتری که پر سیاه و سفیددارد . |
| **ئنە** : هەناسە | نفس . دم . |
| **ئنە چنە** : هەناسەچن | قطع نفس . |
| **ئەمدکەتەرەتی** : هەناسە وێستان | نفس بندآمدن . |
| **ئەزموشت** : ئەزمۆن . تاقیمانە | آزمایش . |
| **ئەزموشت‌کردە** : تاقی‌کردنەوە | آزمایش‌کردن . |
| **ئەل** : پەلیك . خۆکنخاندن | الك چوب کوتاه بازی الك دولك . اصرار و سماجت . |

| | |
|---|---|
| **ئەلکو** : بەلیك | بازی الك . دولك . |
| **ئەلەرەگ** : حاجی لەقلەق | لك‌لك . |
| **ئەلا** : ئێلەگ | الك . |
| **ئەلەنگو** : بازنە | نوعی دستبندمبله‌ای از طلا یا مطلا میباشد . |
| **ئەلوی** : هەڵاو . گڕی ئاگر | شعله آتش . |
| **ئەلوی** : هەڵۆ | پرنده‌ایست شکاری عقاب . |
| **ئەلوات** : لۆتی . لات . دەربەدەر | آدم لات و سرگردان . |
| **ئەلواتە** : هەڵبەتە . ئەڵبەتە | البته . |
| **ئەلی** : هەڵوژە | آلو . (۲) |
| **ئەلی‌سیە** : هەڵوژەی ڕەش | آلو سیاه . |
| **ئەلی‌والی** : ئالوبالو | آلبالو . |
| **ئەم** : ئاسایش . ئەمن و ئاسایش | امن . درامان . |
| **ئەمار** : عەمبار . ئەنبار | انبار . |
| **ئەمارکردە**: عەمبارکردن. کۆکردنەوە | انبارکردن . |
| **ئەماڵە** : ئامرازی پاککردنەوە | آلت تنقیه . |
| **ئەماڵەکردە** : پاککردن | تنقیه‌کردن . |
| **ئومایەن‌ورەتە** : هاتن و چوون | آمدن و رفتن . |
| **ئیمجال** : دوایی . لەپاشا | این کلمه حرف ربطاست و بمعنی پس یا سپس استعمال میشود. |
| **ئەنار دونگ** : دانەی هەنار | دانه انار خشک‌شده ناردان . |
| **ئەنارسو** : باخی هەنار | انارستان . |
| **ئەناشتا** : ناشتا | صبحانه ، ناشتائی . |
| **ئەنتەر** : مەیموون | میمون . اشخاص زشت‌را بیز گویند . |
| **ئێز** : پسو . ئیجازە | اجازه |
| **ئەنگلات** : مائل . چاوەڕوان | منتظر . معطل |
| **ئەنگورە** : گڕۆ . قسەی بەگریە | صحبت‌کردن با صدائی که توام با گریه‌است . |
| **ئەنگیر** : ترێ . هەنگور | انگور . |
| **ئەنوس** : وەنەوز | خواب موقت . پینکی . |

---

(۲) بە تێکڕایی (ی) قەڵەو و (ل)ی قەڵەو لە لوڕیدا زۆر زۆر کەم دەکەمەنە . وەك لە نێوانی ئەم وشانەدا بەرچاو دەکەوێ .. هەر بۆیەشە دەبێ ئەمەمان زۆر لە بەرچاو بگیرێ .

| کوردی | فارسی |
|---|---|
| **نوو** : ئاو | اب . |
| **نووار** : وێرانه . کەلاوە | آوار . خرابه و خاك ساختمانی كه خراب شده‌است . |
| **نەواز** : ئاواز | آواز ، صدا ، صوت . |
| **نونوفتایه** : وسڵ کردن | آب آفتادن . |
| **نەواڵپورس** : هەواڵپرسین | احوال‌پرس . |
| **نوونەلی** : ئاوی هەڵووژە | آب‌آلو . |
| **نوونەمار** : ئاوی عەمبار | آب‌انبار . |
| **نوونەناو** : ئاوی هەنار | آب‌انار . |
| **نووبەن** : میزگیران | شاش‌بند . |
| **نووبیه** : توانەوە | آب‌شدن . ذوب‌شدن . |
| **نووپاش** : ئاوپاش . ئاوپرژێن | آب‌پاش . |
| **نوپاشوکرده** : ئاوپرژێن کردن | آب‌پاشی‌كردن . |
| **نووپشکو** : ئاوپرژێن بە دەس | آب‌پاشی بادست . |
| **نۆچه** : ئەوێ | آنجا . |
| **نووخینوو** : خوناو . شەونم | خونابه . |
| **نوودار** : ئاودار | آبدار . صفت برای میوه . كاری كه سودی‌داشته باشد . |
| **نەوداڵ** : عەوداڵ . دێوانە | درویش بیابان‌گرد . ابدال . |
| **نوودەس** : ئاودەس | مجازا بمعنی متراح‌است . |
| **نوورەنگ** : بەنگین . زۆر جوان | مجازا بمعنی زیبائی‌است در انسان. |
| **نووری** : ئابڕوو | آبرو . حیثیت . شرافت . |
| **نووری‌دەریزی** : ئابڕووچوون | آبروریزی . |
| **نووریشم** : ئاوریشم | ابریشم . |
| **نوریشمی** : ئاوریشمی | ابریشمی . |
| **نوونزولك** : کێم . ئاوەزوون | آب و لنفی كه در اثر سوختگی زیر پوست بدن جمع میشود . تاول آبله . |
| **نووزیرکه** : دزۆزۆ . ئاوری‌بن‌کا | آب زیرکاه . |
| **نووس** : ئاوس | آبستن . |
| **نوسه** : چاوش . گۆینده | خنیاگر . مطرب . |
| **نوسا** : وەستا | استادكار . كسی كه در كاری مهارتی دارد . |
| **نوسار** : هەوسار | افسار . |
| **نۆسه** : ئەوسا | آنوقت . آنموقع . |

**نووتـــەلاكاری** : رێركفـت‌كردن . تەلاكاری — تذهیب‌كاری . آب طلا كاری .

**نووغوره** : ئاوی‌غوره . بەرسیله — آب‌غوره .

**نووكەشیه** : ئاودر — چركی شدن زخم در اثر آلوده‌شدن، شستشو و آبكشی لباس .

**نووكرده** : ئاوكرده — آب‌كردن . با تدبیر كالائی‌را فروختن .

**نووكی** : ئاوەكی — آبكی .

**نووگوشت** : ئاوگوشت . گوشتاو — آبگوشت .

**نووگه** : ئاوگه . — نهبگاه . ابگاه .

**نووگیر** : گۆم . بلاوبالێو — مقداری از حجم چاه كه پر از اب‌است . ظرفی مسی دسته‌دار كه در هنگام برنج پختن از آن استفاده میشود .

**نوولا** : ئەولا — انطرف . انسو .

**نووله** : ئاوله — آبلــه .

**نوولەرێ** : ئاولەڕێ — آبله‌رو .

**نووله‌كوفته** : ئاولەكوتان — آبله‌كوبيدن .

**نووله‌كو** : ئاولەكوت — آبله‌كوب .

**نووولیمو** : ئاوی لیمۆ — اب‌لیمو .

**نوولیو** : ئاوی برنجی پالێوراوا — آب‌جلو .

**نوومال** : ئاودێر — كسی كه اب‌را بمزرعه میرساند .

**نوومالك** : ئاومالك — هیزمی كه از رودخانه گرفته شود.

**نوومروار** : ئاوی مرواری — آب مروارید .

**نوونەوات** : ئاوی نەبات — اب نبات .

**نوونووه** : نۆبەئاو — نوبه آب در مناطق مختلف لرستان برای اب نوبه جهت آبیاری تقسیماتی هست كه به نسبت مقدار زمین مقدار ساعت آن فرق دارد و بجای ساعت از سایه‌های درخت و سنگ استفاده میشود.

**نووەنه** : جۆگەكێشان — اب‌انداختن از جوبی بجوی دیگر .

**نووه** : ئاونگ . شەونم خوناو — شبنم .

**نووهەرێ**: ئاوخۆرێ. پیاله.پەرداخ — آبخوری .

**نووێ** : ئاوێ — رنگ آبی .

| | |
|---|---|
| **نوویێ** : ئاوێ | صد کلمه دیم . زراعت یا زمینی که آب جاری دارد . |
| **نووبار** : ئاوبار | آبیـــار . |
| **نووباری** : ئاوباری | آبیاری . |
| **نووباریکرده** : ئاوباریکردن | ابیاریکردن . |
| **نوتر** : لەر . لاواز | لاغر . نحیف . |
| **نویەکه** : ئەوبەکه | آنیکی . |
| **نوویو** : ماڵئاوایێ | آباد . خانهآباد . این جمله در مقام دعااست . |
| **نوویونێ** : ئاوەدانێ | آبادانی . |
| **نەهلیحەق** : ئەهلی حەق . حەقە | نامیکی از فرق مذهبی است که در دلفان و بلوران کوهدشت زندگی میبنمایند اینهارا «علی الهـوی» نیز میگویند برای اطلاع بیشتر رجوع شود بکلمه « علی الهوی ». |
| **نی** : ئەم | این . |
| **نەبەتێ** : وەختەکێ | موقتی . بطور موقت . |
| **نیچناکونه** : لەوێ | اینجا . |
| **نیچه** : لەوێ | اینجا . |
| **نیسایه** : وەستان | ایـــسادن . |
| **نیسه** : ئێستا . ئێسا | حالا . اکنون . |
| **نیل** : عێل . ئێل . خێل | ایل . طایفه . |
| **نیلا** : ئەولا | این طرف . |
| **نیمرو** : ئەمڕۆ | امروز . |
| **نیمسال** : ئەمساڵ | امسال . |
| **نیواره** : ئێواره | عـصر . نزدیـك غروب آفتـــاب گویند . (٤) |



---

(٤) ریزکردنی وشەکان لە ئەسڵی ئەرهەنگەکەدا چۆن بـوو ، ئاوا لە زۆر شوێنا جێم هێشت .. !! .

# ـ ب ـ

| | |
|---|---|
| **باب ، باو** : باو | مناسب . درخور . |
| **باخته** : سەما ، جۆرە سەمایەکە | رقصیدن . باختن در قمار . |
| **باد** : ئاوسـان | ورم . آماس . |
| **بادفیژه** : گەردەلوول | گردباد . دیوباد . بادگیژه . |
| **بادکرده** : باتێکردن . فوتێکردن | دمیدن و فوت‌کردن دربار کنـك و بادکردن گوسفند پس‌ازسربریدن. |
| **بادگیر** : باگیرەی سەماوەر و چرا | بادگیر سماور و قلیان و سرپیچ چراغ . |
| **بار** : بەر . بەری میوەهات | ثمر . میوه . |
| **بارئووەرده** : وەبەرهێنان | بروررش‌دادن . بار آوردن . |
| **بارونی** : رۆژی بەباران | صفت برای روزی که در آن روز باران میبارد . |
| **باریکو** :دەردە باریکە بارریکوینێسی | مرضی است که موجب لاغری و ضعف بنیه میشود . |
| **باز** : گای نەنی | صفت برای گاوی که پیشانی و دمش خال سفید دارد . |
| **بـــازازگەرمی** : رەواجـــکاری . بازازگەرمی | نوعی تبلیغ برای فروش کالااست که فروشندەبرای حریص‌کردن مشتری بکار میبرد . |
| **بازازی** : بازازی | متاعی که در تهیه آن دقت فراوان نشده . |
| **بازنه** : بازنه | رقاص . |
| **بازووەن** : بازیبەند | بازوبند . |
| **بازی‌باز** : باریکەر ، وازی‌باز | بازیکن . کسی که اهل بازی باشد. |
| **بازی‌کرده** : وازی‌کردن | بازی‌کردن . |
| **بازی‌کو** : وازی‌کەر باریکەر | بازی‌کن . بازیگر . |

| | |
|---|---|
| بازیگۆش : نەکارە . لاسار | کسی که از کار دوری مینماید و بازی مشغول میشود . |
| باشو : باوەشێن | بادبزن . |
| باقە : باقەی گەنم ، باخە | یکدسته گندم که تازه دروشده و روی زمین گذاشته شده . |
| باقلە : باقلە ، کێلگەی باقلە | باقلا . مزرعه باقلا . |
| باك : ترس . باك | ترس . |
| باكداشتە : ترسان . بەباك | ترس‌داشتن . |
| بال : باڵ . دەست | با اضافه‌کردن این واژه به نوع لباس به معنی آستین است . دست . |
| بالاخونە : بالاخانە | طبقه فوقانی . بالاخانه . |
| بازلە : بازیلە . بالندەیەکە بە قەد چۆلەکەیێ | پرنده‌ایست به اندازه گنجشك . |
| باشکیم : بەشکەم ، بەلکو | شاید . |
| بالشت : سەرێن . بالیف. پالێشت | متکا . بالشت . |
| بالشتە : بالیفی بچۆك | بالشت‌کوچك . |
| بال‌شەنە : بالەشنە ، بالەفڕكە | بال‌زدن . |
| بالۆش : باغەل . باوەش . ئەمێز ، نێوان دۆدەست مشت. | بغل . آغوش . مقداری چیزی که در میان دو دست جای‌گیرد . |
| بالونە : بالندە | پرنده . |
| بامبۆل : تەلەکە و فێڵ | نیرنگ و حیله . |
| باوسیل : مایەسیر | بواسیر . |
| باوو : ماڵ و کەسی بوك | خانه و خانوادهء عروس . |
| باونی : باوەخونی | آنچه که عروس از خانهء پدر بعنوان هدیه بخانهء شوهر میبرد . |
| باوە : بابە . باوە . باوك | پدر . بابا . |
| باوەنیە : بەیبون | بوته‌ای‌است که گلی سفید و معطر دارد و این گل‌را خشك نموده در کوکو میریزند . |
| بای : با | باد . |
| بای نومایە : باهاتن | بادآمدن . |
| بای ناوردە : باداری | ورم‌کرده . |
| بای‌سور : بای سوور و کوشندە | باد سرخ . |
| بای‌شەمە : باوەشێن | بادبزن . |
| بای‌کەپو : جۆرە مارێکی بێ ژەهرە | مار بزرگی که زهر ندارد و شکار |

= حودرا مى‌بلعد

**بای‌کرده** : فوتێکردنی ئاژەڵ لە کاتی سەربڕین
فوت‌کردن . بادکردن گوسفند پس از سربریدن .

**بای کەش** : باکردو . هەڵماو
بادکش از استکان یا شاخ حجامت برای بادکش استفاده میشود .

**بایم** : بایەم . باوێ . داری بادەم
بادام . درخت بادام .

**بایمجو** : باینجان
بادمجان .

**بایمسو** : جەنگەڵی بادەم
بادامستان .

**بەتری** : بەدترین
بدترین .

**بتمو** : بنەو . ئەو کچەی کچێنی نەبڕابێ .
بن‌بست . دختری که برده بکارت او استخوانی باشد . دخترگی غنچه ببچ .

**بولتە** : کرۆك . بۆلە
بوته . مانند بوتهٔ کاهو و مانند آن.

**بەچچ** : ئاونێفەك . پینە . بوخچە
خشتك. تکه پارچه‌ایکه در نشیمنگاه شلوار دوخته میشود .

**بەچ** : بەچە
بچه .

**بچ** : لقی شکاو
باقیماندهٔ شاخهٔ شکسته که بتنهٔ درخت مانده‌است .

**بەچ بەچەزا** : بەچەزا . کوڕەزا . کچەزا
فرزند فرزندزاده . نبیره .

**بچبچی** : پێچ‌پێچ
چوبی که گره‌گره‌است .

**بچلك** : داری دبلانێ
شاخهٔ کوچك خشك درخت که بتوان بآن چیزی آویزان کرد .

**بەچ ملی چملە** : بەچکە چۆلەکە
جوجهٔ گنجشك .

**بەچو** : منال . بەچەها ، نەوە
بچه‌ها .

**بەچولە** : منداڵ تا دەگاتە تەمەنی شەش مانگی .
نوزاد تا شش ماه پس از تولد .

**بەچونە** : منالانە . کەلوبەلی منالانە
بچگانه . کودکانه . لباس اسباب و رفتار مخصوص کودکان .

**بەچە** : بەچە . ساوا . منال
کودك . بچه .

**بەچەدار** : منالدار . بەچەدار
صاحب بچه . بچه‌دار . (۱)

---

(۱) زۆربەی زۆری پاشگر و پێشگرەکان لە دیالێکتی لوڕێ و شێوە زمانەکانی دیکەی کوردیدا ، وەکو یەکن . وەکو : ( دار ــ بار ــ کا ــ مەند ــ انێ ــ یەتێ ... تاد ) نموونەیش پڕاوپڕی تێو ئەم فەرهەنگەیە .

| کوردی | فارسی |
| --- | --- |
| **بەچەدارییە**: منالداری، بەچەداری | بچەدارشدن . |
| **بەچەبازژەنە** : لەبارچوونی منال | سقط شدن بچە . |
| **بەچەدو** : بەچەدان . منالدان . پزدان | رحم . زهدان . |
| **بەچەزا** : کوڕەزا . بەوە | فرزندفرزند . نوه . |
| **بەچەقلا** : جوجەلەی قەل | جوجه‌کلاغ . |
| **بەچەوەنە** : منال فڕێدان | بچه‌انداختن . سقط جنین کرن . |
| **بەچەیی** : بەچەیی . منالانە | بچگی . |
| **بوخت** : بوختان | تهمت . |
| **بوخترختە** : بوختانکردن و ریکخستن | تهمت‌زدن . |
| **بوختوم** : بوختان | تهمت . |
| **بوختومرختە** : بوختانکردن | تهمت‌زدن . |
| **بخەر** : بکڕ . کڕیار | خریدار . |
| **بخوردەیە** : بکڕ | بخوردادن . |
| **بەدبیاری** : سەرنەکەوتن لە کار | عدم موفقیت در کار . |
| **بەدنوم** : ناخۆش | بدمزه . |
| **بەدحال** : بەدحال . سەرەمەرگ | شخصی که مریض و مشرف بمرگ است . |
| **بەدحەرف** : بەدزمان . بەدقسە | تندخو . بدزبان . |
| **بەدخوفت‌وخو** : بەدکۆ . بەدزمان | کسی که در خواب حرف میزند یا راه میرود . |
| **بەددل** : کینەدار . دڵپیس | کینه‌ای . کسی که نسبت بهمه چیز و همه کس بدبین است . |
| **بەدرفە** : خواحافیزی . بەڕێخستن | مشایعت . |
| **بەدرفەکردە** : خواحافیزیکردن | مشایعت‌کردن . |
| **بەدرە** : ڕێگای تۆش و هەڵدێر | راه بد و صعب العبور . |
| **بەدزوو** : بەدزمان | بدزبان . |
| **بەدفلق** : بەدکردار . بەدخۆ | بدرفتار . بدعادت . |
| **بەدگل** : بەدگل . ناجسن | بدترکیب . در برابر خوشگل . |
| **بەدگمو** : بەدگومان . ڕاژا | بدگمان . |
| **بەدگوێیکردە** : بەدگوێی | بدگویی کردن پشت سر کسی حرف بدزدن . |
| **بەدمل** : جێکر | در برابر اصل . |
| **بەدها** : بەدخواز | بدخواه . |

| کوردی | فارسی |
|---|---|
| **بڕ** : لال | کسی که لکنت زبان دارد . |
| **بوڕزا** : بڕنده . تیژ | برنده . توسعا به افراد کار برو لایق تیز میگویند . |
| **برادو** : جزدان | کیف بغلی . |
| **برار** : برادەر . هاوڕێ | برادر . |
| **برارزا** : کوڕی برادەر | برادر زاده . فرزند برادر . |
| **برارژنه** : ژنبرا | برادر زن . |
| **برارگەپ** : براگەورە | برادر بزرگ . |
| **برارواروونه** : برابانه | برادروار . همانند رفتار دو برادر با هم . |
| **براری** : برادەری . هاوڕێبەتی | برادری . |
| **بوراق** : نەترس . ئازا | گستاخ . جسور . |
| **بوراقی** : نەترسان | گستاخی . |
| **بوراقیکرده** : ئازایی | گستاخی‌کردن . |
| **برالیک** : داری هەڵوژەی شاخی | درخت آلبالوی کوهی . |
| **براووار** : بەراوەر . بەرامبەر | برابر . روبروی . مقابل . |
| **بوربور** : دەستە دەستە . گرێ گرێ | دسته‌دسته . گروه‌گروه . |
| **بورج** : قەزەولی تفەنگ | مکسك تفنگ . |
| **بەرج** : زیادە خەرج | خرج اضافی در زندگی . |
| **برج** : بە مجاز بۆ زمان و بیرکردنەوە بەکاردێ | مجازا بمعنی زبان یا فکر و اندیشه تنها مورد استعمال آن در چنین جمله‌است . |
| **بەرد** : بەرد | سنگ . |
| **بەردتەش** : بەردئاشی . سەنگتاش | سنگ آتش‌زنه . سنگ چماق . |
| **بەرز** : بەرز . بەرزی | بلند . بلندی . |
| **بەرزگر** : جوتیار ، چێنەر | برزگر . زارع . |
| **بەرزگریکرده** : جوتبەندەیی | زراعت‌کردن در زمینی که مالك آن کسی دیگراست . |
| **بورسه** : بڕین | بریدن . |
| **بورساق** : ئازا ، دلێر | گستاخ . |
| **برشتو** : چێشتی کوکی | آرد و پیازی که در روغن سرخ‌شده باشد این مخلوط‌را در آب عدس یا آب‌گوشت مرغ و خروس میریزند . |
| **بەرەص** : گوڵی | پیسی روی پوست بدن خالهای |

سفیدی ظاهر میشود که بعدا تمام پوست‌را می‌گیرد .

**بەرفاو** : بەفراو — آبیکه از ذوب‌شدن برف جاری میشود . آب برف .

**بەرفوبوکردە** : بەفرمالین — «برف روبی» برف‌را از پشت بام منزل پاک‌کردن .

**بەرەفتاو** : بەرهەتاو . بەرڕۆژ — زمین آفتابگیررا گویند .

**بوژکاری** : بژبەکاری . سەپانی — نوعی مقاطعه کاری‌است باین طریق که صاحب مزرعه جو یا گندمی دروکردن و خرمن نمودن و همچنین کوبیدن و جداکردن دانه‌را از کاه تا موقع تحویل دادن بصاحب مزرعه بکسی وا گذار مینماید یک پنجم از عایدی‌را به «برکار» میدهد این عمل‌را « برکاری » میگوید .

**برگ** : سنجوق — چوب کوتاهی‌است که آنرا مانند نیزه بسوی کسی یا چیزی پرتاب مینمایند .

**بوژگرته** : بژبوژێن . پێشبڕکە — مسابقه گذاشتن باین صورت که بین دو یا چند نفر که کاری مشابه‌را انجام میدهند مسابقه گذاشته میشود که چندکاررا که مقدار و اندازه آنها یکسان‌است چه کسی زودتر میتواند انجام دهد .

**بوژگوش** : برۆنگ ، نێوانی دوو باران — فاصله کوتاه بین دو رگبار باران‌را گویند .

**بەرگە** : بەرگن ، بەرەگن . — پشم برهء یکساله .

**بەرگلو** : شوانی بەرغەل — کسیکه بره‌هارا برای چرا میبرد .

**برم** : برۆ — ابرو .

**بەرمیت** : میو . مۆمی هەنگوین — موم عسل .

**برووەر** : بەراوەر . بەرامبەر — برابر .

**برە** : بەرخ — بره .

| کوردی | فارسی |
| --- | --- |
| **بوزه بوزه** : بزرکانی شـیر ، بزرکبزرک | بریده‌بریده . |
| **بەرهەمردە** :رەنجان، لێك هەڵەنگوتن | تلافی‌کردن . برخوردکردن . از سخنی نامناسب رنجیدن . |
| **بریژە** : بنێشت . بنێشتی کوردی | نوعی شیره، گیاهی‌است که آنرا میجوند . سقز . |
| **بریق بەرق** :زریق‌وباق .تریسکانەوە | تلالو . درخشندگی . |
| **بەزم** : بەدگوێی . بەزمپێ‌کردن | بدگوئی . غیبت . |
| **بەزم‌گرتە** : بەزمگێران . بەدکرداری | بدگوئی‌کردن . تقلید کسی‌را کردن بطور شوخی . |
| **بوزمژنەك** : بزن‌مژە . بزن‌مشك | بزمجه . |
| **بژار** : بژار | نخاله . |
| **بەستە** : بەستن | بستن . |
| **بوستخە** : بوخچە | بقچه . |
| **بەفا** : وەفا . بەفا | وفا . |
| **بوق** : بوغ . دۆکەڵ | دم و هوای آلوده اطاق یا زیر زمین. |
| **بوق‌بەرق** : ئازایی ، دلازایی | گستاخی . |
| **بوقچە** : بوخچە (بوخچە جکەرەبەك) | واحدی برای بعضی اجناس مانند نخ . |
| **بکس** : بنکوس | وجب . فاصله‌میان دو انگشت . |
| **بل‌باریك** : مل‌باریك ، لاواز | لاغر . نحیف . |
| **بولبولی‌کردە** : ئازایی | گستاخی . |
| **بەلریقە** : رەوانی‌سك | اسهال شدید . |
| **بەلك** : بەلك . بەرگی گیا | برگ گیاه . |
| **بەلگە** : بەلکە . نموونە . نیشانە | نمونه و نشانه‌ای از مال دزدیده شده . |
| **بلەد** : رێنما و شارەزا | راهنما و بلدی . |
| **بولنگ** : بلند ، بەرزی | بلند . |
| **بولنی** : بلندی | بلندی . |
| **بلوم هەرکردە** : لێك شکاندن | درهم‌خردکردن و درهم شکستن انسان بوسیله، حیوانی وحشی مانند خرس و پلنگ . |
| **بلە** : چیلکە | تکه چوبهائیکه برای سوخت از زمین جمع میکنند . |
| **بەلی** : بەرۆ ، داربەڕۆ | بلوط . درخت بلوط . |

